# بەڵگە شەرعیەکان

## سەبارەت بە سەلماندنی

## جنۆکە ڕۆشتنە ناو لەشی مرۆڤ و توشکردنی بە ویستی خوای پەروەردگار


**ئامادەکردنی**

**مامۆستا عدنان بارام**


=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=-=


لەبڵاوکراوەکانی

 **ماڵپەڕی بەهەشت** 

**www.ba8.org**

 islam_kurd_ba8@yahoo.com

 07701517378

**عێراق - کوردستان - کەلار**

هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

**کتێبی ژمارە ﴿٦٤﴾**



## پێشەکی :

إنَّ الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ ، وَنَسْتَعِيْنُهُ ، وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوْذُ باللهِ من شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَات أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ... وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ [آل عمران : ١٠٢]

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ [النساء : ١]

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ [الأحزاب: ٧٠ ــ ٧١ ]

أَمَّا بَعْدُ : فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْث كِتَابُ اللهِ ، وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ ، وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُها ، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ .

**مشت ومڕی نێوان زانایانی ئەهلی سوننە وکۆمەڵ وتاقمە لاڕێکانی تر لە بنەواکانی وەرگرتنی بیروباوەر ولێکدانەوەی فەرموودە ، و دانانی پلە و مەنزیلە بۆ عەقڵ ، وشوێنی عەقڵ لەو لێکدانەوەیەیدا بۆ بابەتەکان ، باسێکی کۆنە و لە دێر زەمانەوە سەری هەڵداوە ، تاقم و کۆمەڵانێکی وا هەبوون وهەن پلە ومەنزیلەی عەقلیان پێش خستووە بە سەر نەقڵدا لە هەموو شتێکدا ، بۆیە هەر شتێك عەقڵیان نەیخوێندبێتەوە ، و لێ ی تێنەگەیشتبێتن ڕەتیان کردووەتەوە ، و بە پێچەوانە و لاوازیان زانیوە !!! با ئەو شتانەش لە نەقلی ( صحیح ) یسدا سەلمێنراو و جێگیر بوو بێت ، (( بۆ نمونە گروپی ( الخــوارج ) هەندێك لە بەڵگەکانی قورئانیان وەرگرتووە و هەندێکی تریان ڕەتکردووەتەوە ، و هەندێکیشیان لە بەڵگەکانی سوننەت وەرگرتووە و هەندێکی تریان ڕەتکردووتەوە ، هەروەها گروپی ( المرجئــة ) ش هەندێکیان وەرگرتووە و هەندێکیان ڕەتکردووەتەوە ،بە هەمان شێوە هەڵگرانی بیری ( الاعتــزال ) هەندێکیان وەرگرتووە و هەندێکیان ڕەتکردووەتەوە ، ئا بەم شێوەیە تاکو کۆتایی ، هەروەها عەقلی خۆیان زاڵکردووە بە سەر بەڵگەکاندا ، و بەڵگەیان کردووە بە شوێنکەوتەی عەقڵ !!! یان بەڵگەیان تەنها بە عەقڵ هێناوەتەوە و هەر ئەویان بە ڕەوا داناوە !!! وە ووتوویانە ئەگەر بەڵگەی قورئان و سوننەت پێچەوانەی عەقڵ بوویەوە ئەوا نابێت بکرێت بە بەڵگە و بە بەڵگە بهێنرێتەوە !!! چونکە لە لای ئەوان عەقڵ شتێکی یەك لایە ، کەچی بەڵگەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەریان ﷺ و کردەوە و گوفتاری پێشینی ئەم ئوممەتە شوێنی گومانە ، هەروەکو گومانیان پێ دەبەن !!! بۆیە هەندێکیان ووتوویانە : عەقڵ دادوەر و قازیەکی بە ڕاست دانراوە ، و شەریعەتیش وەکو شاهید وایە !!! واتە : پلەی عەقڵیان بە دادوەر و فەرماندەر داناوە کە هەر ئەویشە شتەکان یەك لا دەکاتەوە ، و ڕۆڵی شەرعیش گەواهی و شایەتی دانە !!!**

وە ئەمەش گەورەترین سیفەت و ئەدگارێکە کە ئەو کەسانەی پێ بناسرێتەوە کە ڕێگەی هاوەڵانی پێغەمبەریان هەڵنەبژاردبێت . ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێت .... بەڵام بەڵگەی ئەهلی سوننە وجەماعەش لە سەر هەموو بابەتەکانیان لەو باسانەی کە پێی ناسراون و جیا دەکرێنەوە لە غەیری خۆیان ، و هاودەنگن لە سەری بریتیە لە : قورئان و سوننەت و کۆڕای زانایان ، وە سەبارەت بە عەقڵیش بە شوێنکەوتەی نەقڵی دەزانن ، چونکە کە شەریعەت ئاماژە بە عەقڵ دەدات بۆ ئەوەیە بە هۆیەوە لە بەڵگە و دەقی قورئان و سوننەت تێبگەین ، نەك ئەوەی کە ببێت بە بەرهەڵستکاری ئەوەی کە نەقڵ ئاماژەی پێ دەکات !!! چونکە عەقڵ ئیجتیهادی تاکێکە ، کەچی بەڵگە سروش ( وحـــي ) خوای پەروەردگارە ... )) [1] .

زانراویشە کە (( ... ووشەی " العقل " کە باسمان لێوە کرد هیچ یەکەو بڕێکی دیاری کراوی نیە بۆی بگەڕێتەوە ، لە ڕووی کەسایەتیەکانەوە ، بۆ نموونە بووترێت عەقڵی . بۆ نموونە . خەڵك بەڵگەیە لە سەر ئەوە ، تەنانەت لە عەقڵێکی دیاری کراوی کەسێکدالە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێت ، ئەوەتا دەبینین عەقڵ بە گۆڕانی تەمەن دەگۆڕێت ، بە جیاوازی ئەو زانیارینەش کە هەیەتی ، یان بە هۆی جۆرەکانی دەرك کردن ، و لە سەروی هەموو خاوەن عەقڵێکەوە زاناترێك هەیە ، بۆیە لە شەرعدا ڕێزی عەقڵ گیراوە و کراوە بە شوێنکەوتەی شەرع ، چونکە زۆر شت هەن ناتوانی دەرکیان پێ بکات ، بەڵکو دەبێت شوێنکەوتەی سەرچاوەی ڕەوایی بێت )) [2] .

ڕەنگە شەیتان ئەوەی بۆ هەڵگرانی ئەم بۆچوونە . واتە : پێش خستنی عەقڵ بە سەر نەقڵدا . ڕازاندبێتەوە کە ئەو کارەیان پارێزگاریە لە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، یان لە خودی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەکو شێخ ( محمد ناصر الـــدين الألبـــاني ) . بە ڕەحمەت بێت . فەرموویەتی : (( وأيضاً فإني أريد أن أحذر من ضلالة من ضلالات ذلك الشيخ ( ......! ) الذي ملأ الدنيا بالتشكيك في أحاديث الـــنبي ﷺ والطعن فيها باسم الدفاع عن الرسول ﷺ في كتابه ( السنة النبوية بين أهل الفقه وأهل الحديث ) ... والحقيقة أن كل من درس كتابه هذا من العلماء تبين له ــ كالشمس في رابعة النهار ــ أنه لا فقه عنده ولا حديث ، إلا ما وافــق عقله وهواه ! )) [3] .

واتە : هەروەها دەمەوێت ئاگاداری موسڵمانان بکەمەوە لە گومڕاییەك لە گومڕاییەکانی ئەو شێخە ... کە هەموو جیهانی پڕکردووەتەوە لە گومان لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە گەڵ توانج لێدانیان ، بەناوی پارێزگاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کتێبی ( السنة النبوية بين أهل الفقه وأهل الحديث ) یدا ... کە لە ڕاستیدا هەر زانایەك لە زانایان تاوتوێی ئەم کتێبە بکات بۆی دەردەکەوێت ، کە ئەم کەسە هیچ فیقە و حەدیپیش نازانێت و لە لا نیە ، جگە لەوە نەبێت کە دەگونجێت لە گەڵ عەقڵ و ئارەزوویدا .

(1) ( شريط مفرّغ بعنوان : بعض خصائص الفرقة الناجية ؛ الطائفة المنصورة ، للشيخ صالح بن عبد العزيز آل الشيخ ، الوجه الأول ) .
(2) ( شريط مفرّغ بعنوان : بعض خصائص الفرقة الناجية ؛ الطائفة المنصورة ، للشيخ صالح بن عبد العزيز آل الشيخ ، الوجه الأول ) .
(3) ( السلسلة الصحيحة : ٧ / ٨٢٤ ) .

بەناوبانگ ترین ئەو کۆمەڵانەی کە لە مێژوودا ناویان هەبوو بێت و تاکو ئێستاش کاریگەریان مابێت لە نێو موسڵماناندا ، و شوێنکەوتەیان هەبێت ، گروپ و تاقمی گومڕای موعتەزیلەیە ( المعتزلـة ✽ ) و جەهمی و ڕافیزەن ، لە هەمووشیان زیاتر موعتەزیلەکانن ... کە گومڕایی سەرانیان گەشتووەتە ئەوەی کە بەم شێوە مامەڵەیان لە گەڵ فەرمووده و ووتەی هاوەڵان و زانایاندا کردووە :

✍ لە کتێبی ( التنكيل بما في تأنيب الكوثري من أباطيل ) دا هاتووە کە فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە بۆ ( عمرو ) ی کوڕی ( عبيد ) ی موعتەزیلەیی دەڵێت : (( لو سمعت الأعمش يقول هذا لكذبته !! لو سمعته من زيد بن وهب لما صدقته !! ولو سمعت ابن مسعود يقوله لما قبلته !!! ولو سمعت رسـول الله ﷺ يقول هذا : لرددته !!!! ولو سمعت الله يقول هذا لقلت : ليس على هذا أخذت ميثاقنا )) !!!!!

واتە : ئەگەر بمبیستایە کە ( الأعمـش ) . کە یەکێکە لە پێشەوایان . ئەمە دەڵێت ، ئەوا بە درۆم دەخستەوە !!!! وە ئەگەر لە زەیدی کوڕی وەهبەوە بمبیستایە بەڕاستم دا نەدەنا !! وە ئەگەر بمبیستایە ( ابن مسعود ) ئەم فەرموودەیە دەڵێت لێم وەرنەدەگرت !! ئەگەر بمبیستایە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە دەڵێت ، ئەوا ڕەتم دەکردەوە !!! وە ئەگەر بمبیستایە خوای پەروەردگار ئەمە دەڵێت ، ئەوا دەمووت : تۆ عەهد و پەیمانت لە سەر ئەمە لێ وەرنەگرتووین ، لە سەر ئەمە نەبوو !!!!

✍ وە دەبینین ( النظام ) کە یەکێکە لە سەرانی موعتەزیلە تۆمەتی درۆ دەداتە پاڵ ( ابن مـسعود ) ، ئەوەش تەنها لە بەر ئەوەی فەرموودەی لەت بوونی مانگ ( انشقاق القمر ) ، و فەرموودەی ( السعيد مـن سعد في بطن أمه ) دەگێڕێتەوە ، وە تانە و توانجی داوە لە چەندەها هاوەڵی تری پێغەمبەر ﷺ ، تەنها لە بەر ئەوەی ئەو فەرموودانەی کە گێڕاویانەتەوە بە پێی عەقڵی ئەوان نەبووە !!!

✍ تەنانەت ئەو کارەیان گەشتووەتە ئەوەی کە ( واصل ) ی کوڕی ( عطاء ) بڵێت : ئەگەر ( عائشة ) ، و ( علي ) ، و ( طلحة ) لە لای من شایەتی لە سەر چەپکەیەك بدەن ، ئەو شایەتیەیان وەرناگرم و بە هۆیەوە حوکم لە سەر ئەو شتە نادەم .

هەر لەبەر ئەوەیە دەبینین بیرۆچکە و تێڕوانینی موعتەزیلە بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بنەوایەکی وەرگیراو و چاك بووە لە لای دوژمنانی دینی خوا ، لە ڕۆژهەڵات ناسان و جگە لەوانیش ، ئەوەتا : (( " جولد تسيهر " هەڵوێستی موعتەزیلە بەرامبەر بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بە شتێکی باش دەزانێت ، وە واش دەبینێت کە دید و بۆچونیان بۆ ڕەتکردنەوەی فەرموودە بە عەقڵ ، دید و

---

✽ المعتزلـة : گروپێکی لارێ گومڕان لە مێژووی ئیسلامدا سەریان هەڵداوە ، و شوێنکەوتەی ( واصـل ) ی کوڕی ( عطـاء ) ن ، و زۆر بیروباوەڕی گومڕایان هەیە دیاریدەترین بیروباوەڕیان بریتیە لە پێش خستنی ( عەقڵ ) بە سەر ( نەقل : کە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ) ، دامەزرێنەری ئەم گروپە گومڕایە لە لایان پێشەوا ( الحسن البصري ) ەوە لە کۆڕ ومەجلسیدا دەرکراوە لە بەر بیروباوەڕە گومڕاکارەکانی ، ئەوە بوو جارێکیان ئەو پێشەوایە پێی دەفەرموێ : (( اعتزلنا يا واصـل )) ، بۆیە ناونراون موعتەزیلە ، ئەم گروپە : لە باسکردنی سیفەتەکانی خوای پەروەردگاردا جەهمین ، واتە ئینکاری دەکەن !! وە لە قەدەریشدا قەدەرین ، واتە دەڵێن : کردەوەکانی مرۆڤ لە دروست کردنی خۆیانە و خوای پەروەردگار هیچ ڕۆڵێکی تێدا نیە !! بنەواکانی بیروباوەڕی ئەم گروپە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ لە ناو موسڵماناندا ماوە ، لە چەندەها گروپی گومڕادا ... وە لەوانەشدا کە پێیان دەوترێت : العقلانيـون !! والعـصريون !!! والتنويريـون !!!! والمستنيريون !!!!!

بۆچوونێکی ڕاست و ڕەوانە ، وە هەر ئەویشە کە پێویستە بگیرێتە بەر و سەربخرێت ، لە دژی توند ڕەوان و ئەو کەسانەی حەرفین ، و ووشکن لە تێڕووانینەکانیان بۆ فەرموودە )) [٤] .

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا دەبینین توانجدان و گومان درووست کردن لە سەرچاوەکانی وەرگرتنی بیروباوەڕ بە تایبەت فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم سەردەمەدا ڕێڕەوێکی تری گرتووەتە خۆ کە چەندەها کۆمەڵ و گرووپی لێ کەوتووەتەوە . وەکو ( العقلانیون !!! ) ، و ( الحداثیون !!! ) ، و ( التنویریون !!! ) ، وە لە پێش ئەوانیش بە ناوی ( المستشرقون ) . وە (( سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پارێزراو نەبووە لە دوژمنان لە هەموو کات و شوێن و سەردەمێکدا ، لە ناوخۆ و لە دەرەوەش ، بەڵام لەم سەردەمەدا لە هەموو سەردەمێك زیاتر جەختیان خستووەتە سەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ، کەچی کەسانێك کە لە ڕواڵەتیان پۆشاکی ئیسلامەتیان پۆشیوە وکردووەتە بەر ، و لە دڵیشدا دڵی گورگیان هەیە ، بوونەتە پشتیوانیان دژ بە ئایینی ئیسلام و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ )) [٥] .

بۆیە دەبێت ئەوەمان زۆر لا نامۆ نەبێت کە لە سەردەمانیکی وەکو ئەمڕۆدا ، و کەسانێکی هەرزە و نەزانکار ( کە بە ناو خاوەن بڕوانامەن !!! ) ، لە سەر کەناڵ و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بەناو ئیسلامی ، دێت وباس لە بنەوایەك لە بنەواکانی بیروباوەڕ دەکات ، کە ئەویش بریتیە : لە جنۆکە ڕۆشتنە ناو لەشی مرۆڤ و توشکردنی . بە ویستی خوای پەروەردگار . !!! بێگومان ئەمەش ڕاستی و بەجێ هاتنی ئەو فەرموودەیەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە باسی نیشانەکانی قیامەت ، و نزیك بوونەوەیدا فەرموویەتی : " سيأتي على الناس سنوات خداعات ، يصدق فيها الكاذب ، و يكذب فيها الصادق ، و يؤتمن فيها الخائن ، و يخون فيها الأمين ، و ينطق فيها الرويبضة !! قيل : وما الرويبضة ؟ قال : الرجل التافه يتكلم في أمر العامة " [٦] ، واتە : ساڵانێك دێت هەموو شتێك تێیدا خەڵەتێنەر و پێچەوانەیە ، درۆزن تێیدا بە ڕاست دادەنرێت ، و ڕاستگۆش بە درۆ ، کەسانی خیانەت کار بە ئەمین و دەستپاك دەزانرێت ، و کەسی ئەمین و دەستپاکیش بە خیانەتکار ، لەو ساڵانەدا ( الرويبضة ) دەدوێت !! وتیان ئەی پێغەرمبەری خوا ! ( الرويبضة ) کێن ؟ فەرمووی : کەسانی هەرزە و بێ نرخ و بێ قەدرن ، سەبارەت بە کارە گشتیەکان دەدوێن!!!

یان ئەم کارە ئەوەیە کە پێشەوا ( عمر ) ی کوڕی ( خطاب ) ئاماژەی پێکردووە کە فەرموویەتی : (( فساد الدين إذا جاء العلم من الصغير ، استعصى عليه الكبير ، و صلاح الناس إذا جاء العلم من قبل الكبير ، تابعه عليه الصغير )) [٧] .

واتە : فەساد و خراپکردنی ئایین لەو کاتەدایە کە ئەگەر زانست لە بچوکەوە وەرگیرا ، و گەورەش بە دەستیەوە گیرۆدە بوو ، وە چاکبوون و چاکسازی خەڵکیش لەوەدایە کە ئەگەر زانست لە گەورەوە بوو ، و بچوکیش شوێنکەوتەی بوو .

---

[٤] ( أجنحة المكر الثلاثة وخوافيها ، للأستاذ عبد الرحمن الميداني : ص ٥٠ بتصرف ، وانظر : الاستشراق والخلفية الفكرية للصراع الحضاري للأستاذ الدكتور محمود زقزوق ص ٢٤ ) .

[٥] ( موقف الغزالي من السنة : للعلامة الشيخ الدكتور ربيع بن هادي المدخلي ) .

[٦] ( حسنه العلامة الألباني في السلسلة الصحيحة ، برقم : ١٨٨٧ ) .

[٧] ( قال العلامة الشيخ محمد ناصالدين الألباني : رواه قاسم بن أصبغ بسند صحيح كما في ( الفتح : ١٣ / ٣٠١ ) ) .

**شیخی ئەلبانی دوای گێڕانەوەی ئەم ووتەیە دەفەرموویێت :** (( وما أكثر هؤلاء ( الصغار ) الذين يتكلمون في أمر المسلمين بجهل بالغ )) ، **واتە : ئای ئەو ( بچوك ) انە چەند زۆرن لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ، كە سەبارەت بە كاری موسڵمانان دەدوێن ، بە نەزانینێكی زۆرەوە !!!**

**وە پێشەوا** ( الشعبي ) **ش لەو بارەیەوە فەرموویەتی :** (( إنما هلكتم حين تركتم الآثار ، وأخذتم بالقياس ، لقد بغض إليَّ هذا المسجد ، ... ، معشرُ الصعافقة [٨] ، والصعافقة هم الذين يفدون إلى الأسواق في زي التجار ، ليس لهم رءوس أموال ، إنما رأس مال أحدهم الكلام ، والعامة تسمي من كان هذا مهلسا )) [٩] ، **واتە : دڵنیا بن لەوەی كە ئێوە ئەو كاتە بە هەلاكەتدا چوون كە وازتان هێنا لە شوێنكەوتنی فەرموودە ، و شوێنی پێوەرە عەقڵیەكان كەوتن ، بەڕاستی ئەو كۆمەڵە** ( صعفوقة ) **ئەم مزگەوتەیان لە بەرچاو خستووین ، و ئاشكراشە** ( صعفوق ) **ئەو كەسانەن كە لە بەگی بازرگاندا دەچنە بازاڕەوە ، بێ ئەوەی هیچ سەرمایەیەكی هەبێت ، بەڵكو تەنها سەرمایەیان ووتەكانیانە !! خەڵكی عامەش پێیان دەڵێت** ( مهلس ) .

**بۆیە دەبینین ئەو جۆرە كەسان ووتەی شێخی ئەلبانیان لە سەر جێگیر دەبێت كە فەرموویەتی :** (( أنه خلفي ، معتزلي من أهل الأهواء ، يضاف إلى ذلك أنه جاهل بالسنة و الأحاديث ، إلى ضعف شديد باللغة العربية وآدابها ، حتى كأنه شبه عامي ، ومع ذلك فهو مغرور بعلمه ، معجب بنفسه ، لا يقيم وزنا لأئمة السلف الذين قالوا بخلاف عنوانه كالإمام أحمد وابن تيمية وابن القيم ، والطبري وابن كثير والقرطبي ، والإمام الشوكاني ... )) .

**واتە : ئەو كەسانە خەلەفیەكی موعتەزیلەیین و لە ئەهلی ئەهوائن ، زیاد لە سەر ئەوەش ئەو كەسانە نەزانن بە سوننەتی پێغەمبەر فەرموودەكانی ، لە گەڵ لاوازیەكی زۆریش بە زمانی عەرەبی ، و ئادابەكانی ، وەك ئەوەی بڵێیت كەسێكی عامیە ، لە گەڵ ئەوەشدا كەسێكی لەخۆباییە بەوەی كە دەیزانێ ، مەغرور بووە بە خۆیەوە ، هیچ ڕێز و پلەیەك دانانات بۆ زانایانی سەلەف ، ئەوانەی بە پێچەوانەی ناونیشانەكەی ئەو ووتەیان فەرمووە ، وەك پێشەوا** ( أحمد ) ، و( ابن تيمية ) ، و ( ابن القيم ) ، و( الطبري ) ، و( ابن كثير ) ، و( القرطبي ) ، و( الشوكاني ) ... **هتد** .

**جا لەم نووسینەدا هەوڵی ئەوە دەدرێت ئەو باسە . واتە باسی : جنۆكە ڕۆشتنە ناو لەشی مرۆڤ و توشكردنی . بە ویستی خوای پەروەردگار . كە یەكێكە لە باسەكانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە بخرێتە ڕوو ، ئەوەش لە ڕوانگەی قورئانی پیرۆز و سوننەتە** ( صحيح ) **ەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، و كۆڕای زانایان ، و ڕاڤەوانانی قورئانی پیرۆز ، بۆ ئەوەی چیتر ، موسڵمانان بە ووتەی ئەو جۆرە كەسانە هەڵنەخەڵتێن ، و نەكەونە ئینكار كردنی بنەواكانی بیروباوەڕەكەیان ، و نەبن بە شوێنكەوتەی شوێنكەوتەكانی بیری موعتەزیلە لەم سەردەمەدا ، وە بەوەش نەخەڵەتێن كە پێشكەشكارانی ئەو باسانە لافی ئەوە لێ دەدەن كە بابەتەكەیان بە پێی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ !!!! خستنە ڕووی بابەتەكانیش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت :**

---

[٨] في النهاية ( ٢ : ٣٨٧ ) : هم الذين يدخلون السوق بلا رأس مال ، فإذا اشترى التاجر شيئا دخل معه فيه ، واحدهم " صعفق " وقيل " صعفوق " وقيل " صعفقي " ، أراد الشعبي أن هؤلاء لا علم عندهم ، فهم بمنزلة التجار الذين ليس لهم رأس مال .

[٩] ( الإبانة الكبرى لابن بطة : ج ٢ / ص ١١٥ ، رقم : ٦٠٥ ) .

**❑ ڕۆشتنی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ و تووشی کردنی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەیە :**

**بێگومان جنۆکە دەتوانێت بڕواتە لەشی مرۆڤ و تووشی بکات . بە ویستی خوای پەروەردگار . ئەم ووتەیەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننە وجەماعەیە ، بەڵکو بگرە ئەو باسە جێی کۆڕایی ویەك دەنگی زانایانی ئەهلی سوننە وجەماعەیە لە کۆن تازەدا . ئەو زانایانەی کە لە کۆڕایی و یەك دەنگیدا متمانە دەکرێتە سەر ووتەکانیان ، نەك زانایانی تاقم وگرووپە لارێکان وەك : موعتەزیلە ، وجەهمیەکان ، وئەوانەش کە شوێن پێ وڕچەی ئەو گرووپە لاڕێیانەیان هەڵگرتبێت . ئەمەی خوارەوەش ناوی هەندێك لە پێشەوایان وزانایانی ئەهلی سوننە وجەماعەیە ، کە هەندێکیان کۆڕایی زانایانی پێش خۆیانیان لەو بارەیەوە گێڕاوەتەوە ... لەوانەش :**

**یەکەم: پێشەوا** ( أبو الحسن الأشعري ) **(ك : ٣٢٤ هـ) فەرموویەتی :** (( وإن الشيطان يوسوس للإنسان ويشككه ويتخبطه **خلافاً لقول المعتزلة و الجهمية** ، كما قال الله عـز وجـل : ﴿ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾ ( سـورة البقـرة : ٢٧٥ ) ))[1] ، **واتە : بێگومان شەیتان وەسوەسە بۆ مرۆڤ درووست دەکات ، و دەیخاتە گومان تووشیشی دەکات ، بە پێچەوانەی گروپی لاڕێی** ( **المعتزلة** ) **ە ، و** ( **الجهمية** ) **، هەروەکو خوای پەروەردگار فەرموویەتی :** ﴿ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾ (البقرة : ٢٧٥ ) .

**دووەم : پێشەوا** ( **أحمد بن محمد بن منصور ابن المنيِّر** ) **(ك : ٦٨٣ هـ) فەرموویەتی :** ((**واعتقـاد السلف وأهل السنة أن هذه أمور على حقائقها ، واقعة كما أخبر الشرع عنها** ، ... من ذلك : الـسحر **وخبطـة الـشيطان** ، ومعظم أحـوال الجـن ))[2] ، **واتە : بیروباوەڕی سەلەف ، و ئەهلی سوننە وجەماعە ئەوەیە کە ئەمانە شتێلێکن لە سەر حەقیقەتی خۆیانن ، و بەو شیوەش ڕوو دەدات هەروەکو شەرع باسی لێوە کردوون ، ... لەوانەش : جادو و تووشکردنی شەیتان ، و زۆربەی بار و دۆخەکانی جنۆکە .**

**سێیەم : شێخی پایە بەرزی ئیسلام** ( ابن تيمية ) **(ك : ٧٢٨ هـ) دەفەرمووێ :** ((**ودخول الجن في بـدن الإنسان ثابت باتفاق أئمة أهل السنة والجماعة ... وليس في أئمة الإسلام من ينكر دخول الجني في بدن المصروع وغيره ، ومن أنكر ذلك ، وادَّعى أن الشرع يُكَذِّبُ ذلك ، فقد كَذَبَ على الشرع ، وليس في الأدلة الشرعية ما ينفي ذلـك** ))[3] ، **واتە : ڕۆشتنی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ ، جێگیر و سەلمێندراوە بە کۆڕای پێشەوایانی ئەهلی سوننە وجەماعە ... وە هیچ یەکێکیش نیە لە پێشەوایانی ئیسلام ئینکاری ڕۆشتنی جنۆکە بکات بۆ ناو لەشی تووشبوو ، وجگە لەویش ، ئەوەش کە ئەو شتە ئینکار بکات ، ولافی ئەوە لێبدات کە شەریعەت ئەو شتە دەخاتە درۆوە ، ئەوا ئەو کەسە خۆی درۆی بەناو شەرعەوە کردووە ، وە هیچ بەڵگەیەکیش نیە لە بەڵگە شەرعیەکان لە سەر ئەوەی کە ئەو شتە ڕەت بکاتەوە .**

---

[1] ( الإبانة في أصول الديانة ، للأشعري : ص١٢ ) ، والخبط : الضرب بغير استواء كخبط العشواء ، يتخبطه الشيطان : يصرعه ويضرب به الأرض ، وسيتضح هذا المعنى في سياق عرضنا للأدلة من الكتاب والسنة ، وأقوال أئمة أهل العلم في ذلك .

[2] ( الانتصاف فيما تضمنه الكشاف من الاعتزال ، لابن المنير : ١ / ١٦٤– ١٦٥ ) .

[3] ( مجموع الفتاوى ، لابن تيمية : ٢٧٦/٢٤ ) .

**وە کە باسی تووشبوونی مرۆڤ دەکات لە لایەن جنۆکەوە دەڵێت :** (( وقد اتفق عليه أئمة الإسـلام كمـا اتفقوا على وجود الجن )) [٤] ، **واتە : پێشەوایانی ئیسلام هاودەنگن لە سەری ، هەروەکو چۆن هاودەنگن لە سەر بوونی جنۆکە .**

**چوارەم :** ( ابن حجر الهيثمي ) (ك : ٩٧٤ هـ) **فەرموویەتی :** (( فدخوله ( أي الجني ) في بدنه ( أي الإنسي ) هو مذهب أهل السنة والجماعـة )) [٥] ، **واتە : وە ڕۆشتنە ژوورەوەی . واتە جنۆکە . بۆ ناو لەشی مرۆڤ بۆچوون و مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەیە .**

**پێنجەم : شێخ** ( الآلوسي ) (ك : ١٢٧٠ هـ) **دوای بە بەڵگە هێنانەوەی ئایەتی ( ٢٧٥ ) سورەتی** (البقـرة) **لە سەر تووشکردنی شەیتان بۆ مرۆڤ ، کە تێیدا هاتووە :** ﴿ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾ [٦] ، **دەفەرمووێت :** (( واعتقاد السلف وأهل الـسنة أن ما دلت عليه أمور حقيقة واقعة ، كما أخبر الشرع عنها ، والتزام تأويلها كلها يستلزم خبطاً طويلاً لا يميـل إليـه إلا المعتزلة ومن حذا حذوهم ، وبذلك ونحوه خرجوا عن قواعد الشرع القويم ، فاحذرهم قاتلهم الله أنى يؤفكون )) [٧] ، **واتە : بیروباوەڕی سەلەف و ئەهلی سوننە ئەوەیە کە ئەمانە شتێلێکن لە سەر حەقیقەتی خۆیانن ، هەر بەو شیوەش ڕوو دەدن کە شەرع باسی لێوە کردوون ، هەوڵدانیش بۆ تەئویل کردن ، و لادانی لەواتای خۆی تێکەڵ و پێکەڵ کردنێکی دوور و درێژە ، هیچ کەسێك بۆی ناڕوات جگە لە گرووپی لاڕێی موعتەزیلە نەبێت ، یان ئەوانەی کە ئەو ئاراستە و بۆچوونانەی ئەوانی هەبێت ، ئەوانەش بەو کارەیان دەرچوون و لایانداوە لە بنەوا تەواوەکانی شەرعیەت ، جا بە ئاگابن و لێیان دوور کەونەوە ، خوای پەروەردگار لە ناویان بەرێت ، بۆ ئەو کارەیان کە دەیکەن .**

**شەشەم : شێخ** ( عبد العزيز بن عبد الله بن باز )( **موفتی میرنشینی سعودیەی پێشوو) فەرموویەتی :** (( وقـد دلَّ كتابُ الله عز وجل ، وسنةُ رسوله ﷺ ، وإجماعُ الأُمة على جواز دخول الجني بالإنسي وصرعِه إيَّاه ، فكيـف يجوز لمن ينتسب إلى العلم ، أن ينكر ذلك بغير علم ولا هدى ، بل تقليدا لبعض أهل البدع المخـالفين لأهـل الـسنة والجماعـة ؟! )) [٨] ، **واتە : قورئانەکەی خوای پەروەردگار ، و سوننەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، و کۆڕای ئوممەتیش لە سەر ئەوەن کە ئاساییە جنۆکە بڕواتە ناو لەشی مرۆڤ ، و تووشی بکات ، جا نازانم چۆن کەسێك کە خۆی بە ئەهلی زانست بزانێ ، ئەو شتە ئینکار بکات بەبێ زانست ، و هیچ ڕێگەیەکی شەرعی ، بەڵکو ئەو شتەی لاسایی کردنە بۆ ئەهلی بیدەع ، ئەوانەی کە پێچەوانەی ئەهلی سوننە وجەماعەن ؟!**

**پوختەی ئەم ووتانەش ئەوە دەگەیەنێت کە : بەڵگەی قورئانی پیرۆز ، و سوننەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، و کۆڕای زانایانیش لە سەر ئەوەن کە ئاساییە جنۆکە بڕواتە ناو لەشی مرۆڤ ، و تووشی**

---

[٤] ( الرد على المنطقيين ، لابن تيمية : ص ٤٧ ) .
[٥] ( الفتاوى الحديثية ، لابن حجر الهيثمي : ١ / ٧٣ ) .
[٦] ( روح المعاني في تفسير القرآن والسبع المثاني ، للآلوسي : ٤٩/٣ ) .
[٧] ( المصدر السابق نفسه ) .
[٨] ( مجموع فتاوى ومقالات متنوعة ، لابن باز : ٣٢٠/٣ ) .

بکات . بە ویستی خوای پەروەردگار . هەر ئەوەشە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە وجەماعە ، بە پێچەوانەی بۆچوونی گروپی لاڕێی موعتەزیلە و جەهمیە و هاوبیران و شوێنکەوتوانیان لە کۆن و تازەدا .

## ❑ بەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە سەر ڕۆشتنی جنۆکە بۆ لەشی مرۆڤ ، و تووش کردنی :

### أ : بەڵگەی قورئانی پیرۆز لە سەر ئەو کارە :

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی : ﴿ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾( سورة البقرة : ٢٧٥ ) ، واتە : ئەوانەی کە سوو دەخۆن لە ڕۆژی دواییدا هەڵدەسنەوە لە گۆڕەکانیانەوە ، هەروەکو ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێت ، و شێتی کردبێت ، ئەم ئایەتەیە کە زۆرێك لە زانایان و ڕاڤەوانانی قورئانی پیرۆز کردوویانەتە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە جنۆکە . بە ویستی خوای پەروەردگار . دەتوانێت بڕواتە لەشی مرۆڤ و تووشی بکات ، ئەمەی خوارەوەش ووتەی هەندێکیانە :

پێشەوا ( الطبري ) ( ك : ٣١٠ هـ ) لە تەفسیرەکەیدا فەرموویەتی : (( فقال جلَّ ثناؤه للذين يأكلون الربا الذي وصفنا صفته في الدنيا لا يقومون في الآخرة من قبورهم إلا كما يقوم الذي يتخبطه الشيطان من المس ، يعني بذلك : يتخبطه فيصرعه من المس ، يعني من الجنون ، **وبمثل ما قلنا في ذلك قال أهل التأويل** ))[٩] ، واتە : خوای بڵند و پایە بەرز باسی ئەوانە دەکان کە سوو ( الربا ) دەخۆن ، ئەوانەی کە وەسفمان بۆ کردن لە دونیادا ، لە ڕۆژی دواییدا هەڵناسنەوە لە گۆڕەکانیان ئیللا وەکو ئەو کەسە نەبێت ، کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت ، مەبەستی لە دەست لێوەشاندنیان ، تووشکردنیانە بە هۆی چوونە لەشیان و شێت کردنیان ، ئەمەش کە ئێمە دەیڵێین هەمان ووتەی ڕاڤەوانانی قورئانی پیرۆزە

وە ( البغوي ) (ك : ٥١٦ هـ) دەفەرمووێت : (( ﴿لَا يَقُومُونَ﴾ : يعني يوم القيامة من قبورهم ﴿إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ﴾ **أي يصرعه** ﴿ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ ، أصل الخبط : الضرب والوطء ، وهو ضرب على غير استواء ، .. ﴿مِنَ ٱلۡمَسِّۚ﴾ **أي الجنون** ، يقال **مس الرجل فهو ممسوس إذا كان مجنوناً** ، ومعناه آكل الربا يبعث يوم القيامة وهو كمثل المصروع ))[١٠] ، واتە :﴿لَا يَقُومُونَ﴾ : مەبەستی ڕۆژی دواییە لە گۆڕەکانیانەوە ﴿إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ واتە : شەیتان تووشی کردووە ، بنەوای ووشەی ( الخبط ) بریتیە لە لێدان و پیاکردن ، کە بریتیە لە نموونەی خۆ ڕانەگرتن ، بە هۆی ﴿مِنَ ٱلۡمَسِّۚ﴾ ەوە کە بریتیە لە شێتی ، دەووترێت پیاوەکەی تووش کرد ، پیاوێکی تووش بووە ، ئەگەر شێت بوو بێت ، واتاکەشی ئەوەیە کە سوو خۆر کە زیندوو دەکرێتەوە وەکو تووش بوو وایە .

---

[٩] ( جامع البيان في تفسير القرآن للطبري : ١٠١/٣ ) .

[١٠] (معالم التنزيل للبغوي : ٣٤٠/١-٣٤١ ) .

**وە پێشەوا ( القرطبي ) (ك : ٦٧١ هـ ) فەرموویەتی : (( في هذه الآية دليل على فساد إنكار من أنكر الصرع من جهة الجن** ، وزعم أنه من فعل الطبائع ، وأن الشيطان لا يسلك في الإنسان ، ولا يكون منه مس )) [11] ، **واتە : لەم ئایەتەوە بەڵگەی هەڵەیی ئینکار کردنی ئەو کەسانەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئینکاری تووش بوون دەکەن بە هۆی جنۆکەوە ، و دەڵێن کە ئەو شتە دەگەڕێتەوە بۆ تەبعی مرۆڤ ، وە ئەوەی کە شەیتان ناڕواتە ناو لەشی مرۆڤەوە ، وە هیچ تووشبوونێکی نیە !!!**

**وە ( أبو حيان ) ی ( الأندلسي ) ( ك : ٧٥٤ هـ ) فەرموویەتی : (( والظاهر أن الشيطان يتخبط الإنسان حقيقة )) ، وە فەرموویەتی : (( وظاهر الآية أن الشيطان يتخبط الإنسان ، فقيل ذلك حقيقة هو من فعل الشيطان ، بتمكين الله تعالى له من ذلك في بعض الناس ، وليس في العقل ما يمنع ذلك** ، وأصله من المس باليد ، كان الشيطان يمس الإنسان فيجنه ، ويسمى الجنون مساً ... " [12] ، **واتە : ڕووکەشی ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێت کە شەیتان دەتوانێت دەست لە مرۆڤ بووەشێنێت ، ووتراوە : ئەو شتە لە سەر حەقیقەتی خۆی دەبێت ، و لە کاری شەیتانە ، و بە ئیزن و ڕێپێدانی خوای پەروەردگار دەبێت لە هەندێك لە خەڵك ، هیچ ڕێگرێکی عەقڵیش نیە کە ڕێگر بێت لەو کارە ، بنەواشی لە دەست پێوەدانەوەیە ، هەروەکو بڵێیت شەیتان دەست دەدات بە مرۆڤ و تووشی شێتی دەکات ، وە بە شێتیش دەووترێت ( المس ) .**

**وە ( ابن جزي الكلبي ) (ك : ٧٤١ هـ ) فەرموویەتی : (( أجمع المفسرون أن المعنى : لا يقومون من قبورهم في البعث إلا كالمجنون** ، ويتخبطه يتفعله من قولك : خبط يخبط ، والمس : الجنون)) [13] ، **واتە : ڕاڤەوانان کۆڕان لە سەر ئەوەی کە واتای ئایەتەکە ئەوەیە کە : هەڵناسنەوە لە گۆڕەکانیان لە ڕۆژی دواییدا ئیللا وەکو شێت نەبێت ، ... ، ( المس ) یش : واتای شێتیە .**

**وە پێشەوا ( ابن كثير ) (ك : ٧٧٤ هـ ) فەرموویەتی : (( أي : لا يقومون من قبورهم يوم القيامة إلا كما يقوم المصروع حال صرعه وتخبط الشيطان له** ، وذلك أنه يقوم قياماً منكراً )) [14] ، **واتە : هەڵناسنەوە لە گۆڕەکانیان لە ڕۆژی دواییدا ئیللا وەکو کەسێکی تووش بوو نەبێت . کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت . لە کاتی تووش بوونەکەی و دەست لێوەشاندنی شەیتان بۆی ، ئەو شێوەش هەستانێکی زۆر خراپە .**

## ب : بەڵگەی سوننەت لە سەر ئەو کارە :

**یەکەم : فەرموودەی ( صفية ) ی کچی ( حيي ) کە خێزانی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، دەگێڕێتەوە : "** كان النبي ﷺ معتكفاً ، فأتيته أزوره ليلاً ، فحدثته ، ثم قمت لأنقلب ، فقام ليقلبني ، وكان مسكنها في دار أسامة بن زيد ، فمر رجلان من الأنصار ، فلما رأيا النبي ﷺ أسرعا ، فقال النبي ﷺ : " على رسلكما ، إنها صفية بنت حيي ، فقالا : سبحان الله يا رسول الله ! فقال ﷺ : " **إن الشيطان يجري من الإنسان مجرى الدم** ، وإني خشيت أن يقذف في قلوبكما شراً ، أو شيئاً " [15] .

---

[11] ( تفسير القرطبي : ٣/٣٥٥ ) .

[12] القول الأول في : ( النَّهرُ المادِّ : ١ / ٢٧٥ ) ، والثاني في : ( البحر المحيط : ٢/٣٣٤ ) وكلاهما لأبي حيان الأندلسي .

[13] ( التسهيل لعلوم التنزيل ، لابن جزي الكلبي :١/٩٤ ) .

[14] ( تفسير القرآن العظيم ، لابن كثير :١/٣٢٦ ) .

[15] ( رواه البخاري في : صحيحه ، برقم : ٢٠٣٥ ورقم : ٢٠٣٨ ورقم : ٢٠٣٩ ، ومسلم في : صحيح مسلم ، رقم ٢١٧٥ ، ورواه أبو داود في : سنن أبي داود ، برقم ٢٤٧٠ ) .

**بڕگەی پەیوەست بە باسەکەوە ئەویە : کە شەیتان دەتوانێت بەناو لەشی مرۆڤدا بگەڕێت ، و بسوڕێتەوە ، هەروەکو چۆن خوێن بە ناو لەشی مرۆڤدا دەسوڕێتەوە . وە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو چوونە ژوورەوەیەکی جنۆکە و شەیتان بۆ ناو لەشی مرۆڤ تووش کردنی بێت ، هەروەکو کەسانێکی نەزان دەڵێن : ئەگەر وابایە ئەوا دەبووایە هەموومان شێت ببایەین !!! - وە کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەم فەرموودەیان کردووەتە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە جنۆکە دەتوانێت بڕواتە ناو لەشی مرۆڤ و تووشی بکات ، لەوانەش : پێشەوا ( القرطبي ) لە تەفسیرەکەیدا** [١٦] **، و ( ابن تيمية ) لە ( مجموع الفتاوى ) کەیدا** [١٧] **، و ( ابن حجر الهيثمي ) لە بەرپەرچ دانەوەی گرووپی لاڕێی موعتەزیلەدا کە ئەو کارە ڕەت دەکەنەوە** [١٨] **، و ( البقاعي ) لە تەفسیرەکەیدا** [١٩] **، و ( ابن حجر العسقلاني ) لە کتێبی ( بذل الماعون في فضل الطاعون ) دا** [٢٠] **، و ( العلامة موفق الدين بن عبد اللطيف البغدادي )** [٢١] **،**

**و ( القاسمي ) لە تفسیرەکەیدا** [٢٢] **، وە پێشەوا ( النووي ) یش لە هەندێك لە زانایانی مەزهەبی شافعیەوە دەگێڕێتەوە کە ئەم فەرموودەیەیان کردووەتە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە خوای پەروەردگار توانایەکی وای داوە بە شەیتان کە بەناو لەشی مرۆڤدا بسووڕێنەوە هەروەکو چۆن خوێن بە ناو لەشیدا دەسووڕێتەوە** [٢٣] **.**

**دووەم : فەرموودەی ( عثمان ) ی کوڕی ( أبي العاص ) کە دەگێڕێتەوە :** " لما استعملني رسول الله ﷺ على الطائف ، جعل يعرض لي شيء في صلاتي ، حتى ما أدري ما أصلي ، فلما رأيت ذلك رحلت على رسول الله ﷺ ، فقال : ابن العاص ؟ قلت : نعم ، يا رسول الله ! قال : ما جاء بك ؟ قلت : يا رسول الله ! عرض لي شيء في صلاتي ، حتى ما أدري ما أصلي ، **قال : ذاك الشيطان** ، أدنه ، قال : فدنوت منه ، فجلست على صدور قدمي ، قال : فضرب صدري بيده وتفل في فمي ، **وقال : يا شيطان ! اخرج من صدر عثمان ، ففعل ذلك ثلاث مرات** ، ثم قال : الحق بعملك ، فقال عثمان : فلعمري ما أحسبه خالطني " [٢٤].

**بڕگەی پەیوەست بە باسەکەوە ئەویە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەموو : " ذاك الشيطان " ، واتە : ئەوە شەیتانە ، وە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار فەرمووی : " يا شيطان ! اخرج من صدر عثمان " ، واتە : ئەی شەیتان دەرچۆ لە سینگی عوسمان .**

---

[١٦] ( انظر : تفسير القرطبي : ٥٠/٢ ) .
[١٧] ( انظر : مجموع الفتاوى : ٢٧٧/٢٤ ) .
[١٨] ( انظر : الفتاوى الحديثية : ص ٧٢ ) .
[١٩] ( نظم الدرر في تناسب الآيات والسور ، للبقاعي : ٥٣١/١ ) .
[٢٠] ( بذل الماعون في فضل الطاعون ، لابن حجر العسقلاني : ص ٨٣ ) .
[٢١] ( في كتابه " الطب من الكتاب والسنة " ص ٢٣١ ، نقلاً عن : برهان الشرع في إثبات المس والصرع : علي بن حسين بن علي بن عبد الحميد : ص ١٤٣ ) .
[٢٢] ( محاسن التأويل : ٣٦٠/٣ ) .
[٢٣] ( انظر صحيح مسلم بشرح الإمام النووي : ١٥٧/٤ ) .
[٢٤] ( أخرجه محمد ناصر الدين الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة بهذا اللفظ ، برقم : ٢٩١٨ ، و قال البوصيري ( مصباح الزجاجة في زوائد ابن ماجة ، ٣٦/٤ ) : الحديث صحيح الإسناد ، فرجاله ثقات وإسناده صحيح ، ورواه ابن ماجه ، في سنن ابن ماجه ، رقم ٣٥٤٨، والحاكم في المستدرك على الصحيحين ، وابن أبي عاصم : الآحاد والمثاني رقم ١٥٣٢،١٥٣١ ) .

ڕووی هەڵێنجاندنی بەڵگەش لە فەرموودەکەوە ئەوەیە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : " یا شیطان ! اخرج من صدر عثمان " کە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە جنۆکەکە لە ناو لەشی مرۆڤەکەیە ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکات کە بڕواتە دەرەوە .

شێخ و زانای فەرموودەناسی سەردەم ( محمد ناصرالدين الألباني ) دوای هێنانەوەی ئەم فەرموودەیە فەرموویەتی : (( في الحديث دلالة صريحة على أن الشيطان قد يتلبس الإنسان و يدخل فيه ، ولو كان مؤمنا صالحا ، و في ذلك أحاديث كثيرة )) [٢٥] .

واتە : لەم فەرموودەدا بەڵگەی ئاشکرا و ڕاشکاو هەیە لە سەر ئەوەی کە شەیتان دەتوانێت تووشی مرۆڤ بکات و بڕواتە لەشیەوە ، ئەگەر بڕوادارێکی چاکیش بێت ، وە فەرموودەیەکی زۆریش هەن لەو بارەیەوە .

**سێیەم :** فەرموودەی ( أبو اليَسَر كعب بن عمرو السَّلمي ) ﷺ کە فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەموو : " اللهم إني أعوذ بك من التردي والهدم ، والغرق والحريق ، وأعوذ بك أن يتخبطني الشيطان عند المـوت ، وأعوذ بك أن أموت في سبيلك مدبراً وأعوذ بك أن أموت لديغاً " [٢٦] .

جا پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی : " وأعوذ بك أن يتخبطني الشيطان عنـد المـوت " بەڵگەیەکی ئاشکرای تێدایە لە تووشکردنی و دەست لێ وەشاندن ، ( ابن الأثير) فەرموویەتی : (( يتخبطني ، و تخبطه الشيطان ، ئەگەر دەستی لێبووەشێنێت ، و یاری پێبکات [٢٧] ، وە لە ( لسان العرب ) دا هاتووە : التخـبط من الشيطان : إذا مسَّ الإنسان بخبل أو جنون [٢٨] ، واتە : ئەگەر تووشی مرۆڤ بکات بە گێلی و شێتی .
چەندەها زاناش ئەم فەرموودەیەیان کردووە بە بەڵگە بۆ سەلماندنی دەست لێوەشاندنی شەیتان بۆ مرۆڤ [٢٩] فەرموودەکەش : صحيح الإسناد ، صححه الحاكم ووافقه الذهبي [٣٠] ، والشيخ محمد ناصر الدين [٣١] وقال الشيخ عبد القادر الأرناؤوط : وإسناده حسن [٣٢] ، وصححه محققو سنن أبي داود [٣٣]

**چوارەم :** فەرموودەی ( يعلى ) ی کوڕی ( مرة ) کە فەرموویەتی : " لقد رأيت من رسول الله ﷺ ثلاثاً مـا رآها أحد قبلي ، ولا يراها أحد بعدي ، لقد خرجت معه في سفر ، حتى إذا كنا ببعض الطريق مررنا بامرأة جالسة معهـا صبي لها ، فقالت يا رسول الله ! هذا صبي أصابه بلاء وأصابنا منه بلاء ، يؤخذ في اليوم ما أدري كم مـرة ، قـال : ناولينه ﷺ ، فرفعته إليه ، فجعلته بينه وبين واسطة الرَّحل ، ثم فغر فاه ، فنفث فيه ثلاثاً ، وقال ﷺ : بسم الله ، أنـا عبد الله ، اخسأ عدو الله ، ثم ناولها إياه ، فقال ﷺ : ألقينا في الرجعة في هذا المكان ، فأخبرينا ما فعل ، قال : فـذهبنا ،

---

[٢٥] ( السلسلة الصحيحة ، برقم : ٢٩١٨ ) .
[٢٦] ( رواه أحمد بن حنبل : المسند ٤٢٧/٣ ، وأبو داود في سننه رقم ١٥٥٢ ، ١٥٥٣ ، النسائي : سنن النسائي ، رقم ٥٥٣١ ، و الطبراني : المعجـم الكـبير : رقـم ٣٨٥ ، ١٧/١٩، والمزي : تهذيب الكمال ، ٢٥٢/١٣ ، الحاكم في المستدرك ٧١٣/١ ) .
[٢٧] ( ابن الأثير الجزري ، جامع الأصول في أحاديث الرسول : ٣٦١/٤ ، النهاية في غريب الحديث والأثر : ٨/٢ ) .
[٢٨] ( ابن منظور : ٢٨٢/٧ ) .
[٢٩] ( انظر تفسير القرطبي ٣٥٥/٣ ، فتح القدير للشوكاني ٢٩٥/١ ، برهان الشرع ص ١٢٩، وحيد عبدالسلام البالي: وقاية الإنسان من الجن والشيطان : ص ٦١ ) .
[٣٠] ( المستدرك : ٧١٣/١ ) .
[٣١] ( انظر : صحيح الجامع الصغير وزياداته ، رقم ١٢٨٢ : ٢٧٥/١، و صحيح سنن النسائي ، ١١٢٣/٣-١١٢٤ ) .
[٣٢] ( انظر هامش جامع الأصول : ٣٦١/٤ ) .
[٣٣] ( سنن أبي داود : ٦٦٧/٢ ) .

ورجعنا ، فوجدناها في ذلك المكان معها شياه ثلاث ، **فقال** ﷺ : **ما فعل صبيك ؟ فقالت : والذي بعثك بالحق ما حسسنا منه شيئاً حتى الساعة** ، فاجترر هذه الغنم ، قال ﷺ : انزل فخذ منها واحدة ورُدَّ البقية " [٣٤] .

**ئەم فەرموودەیە چەندەها ( شـاهد ) ی تری هەیە کە لە ڕیوایەتێکیدا هاتووە کە ئافرەتەکە بە پیچغەمبەری خوای ﷺ ووت :** (( ... ، **يا رسول الله إن ابني هذا يأخذه الشيطان كل يوم ثلاث مرات لا يدعه ، فوا الذي بعثك بالحق ما عاد إليه بعد ، ...** )) [٣٥] .

**بڕگەی پەیوەست بە باسەکەوە ئەویە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ : " فغر فاه ، فنفث فيه ثلاثاً ، وقال ﷺ : بسم الله ، أنا عبد الله ، اخسأ عدو الله " ، واتە : دەمی کردەوە و سێ جار تفاندیە دەمی و فەرمووی : بە ناوی خوا ، من بەندەی خوام ، گوم و دوورکەوەوە سەر شۆڕ بە ئەی دوژمنی خوا .... وە ئەو بڕگەیەش کە ئافرەتەکە ووتی :** (( يأخذه الشيطان ... )) ، **شەیتان وای لێ دەکات .**

**ڕووی هەڵێنجاندنی بەڵگەش لە فەرموودەکەوە ئەوەیە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ : دەمی کردەوە و سێ جار تفاندیە دەمی و فەرمووی : بە ناوی خوا ، من بەندەی خوام ، گوم و دوورکەوەوە سەر شۆڕ بە ئەی دوژمنی خوا .... ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەو منداڵە تووشبووی شەیتان بووە ، وە ئەو بڕگەیەش کە ئافرەتەکە ووتی :** (( يأخـذه الـشيطان ... )) ، **شەیتان وای لێ دەکات ، و ئیقرارکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو ووتەیە ، چونکە ئەگەر وا نەبایە ، دەیفەرموو : ئەو کارە لە شەیتانەوە نیە .**

**پێنجەم : لە** ( عطاء ) **ی کوڕی** ( أبو ربَّاح ) **فەرموویەتی :** ( ابن عباس ) **پیی فەرمووم :** " **ألا أريك امرأة** من أهل الجنة ؟ قلت : بلى ، قال : هذه المرأة السوداء أتت النبي ﷺ فقالت : إني أصرع ، وإني أتكشف ، فادع الله لي ، قال : إن شئت صبرت ولك الجنة ، وإن شئت دعوت الله أن يعافيك ؟ فقالت : أصبر ، فقالت : إني أتكشف فادع الله لي أن لا أتكشف ، فدعا لها " [٣٦]

**وە پێشەوا بوخاری لە** ( صحيح ) **ەکەیدا لە** ( عطاء ) **ەوە دەگێڕێتەوە کە ئەو ئافرەتە ناوی** ( أم زفر ) **بووە ، وە بەڵگەکانیش ئەوە دەردەخەن کە ئەو ئافرەتە جنۆکە دەستی لێوەشاندبوو ، و تووشی کردبوو ، هەروەك دەبینین کە پێشەوا** ( ابن حجـر العـسقلاني ) **دوای گێڕانەوەی چەند ڕیوایەتێکی فەرموودەکە فەرموویەتی** (( وقد يؤخذ من الطرق التي أوردها أن الذي كان بأم زفر كان من صرع الجن لا من صرع الخلـط )) [٣٧] .

**واتە : وە لەم ڕیوایەتەی فەرموودەکەوە کە باسم کردن ئەوە دەردەکەوێت کە ئەو نەخۆشیەیی کە لە دایکی زوفەردا بوو دەستوەشاندنی جنۆکە بوو ، نەك لە لەخۆچوونی خەڵتەوە بێت ، وە** ( ابن عبد البر )

---

[٣٤] ( رواه أحمد في المسند رقم ١٧٥٦١ ، ٢١٠/٤ ، ورقم ١٣٥٧٧ ، ١٧٥٧٩ ، ١٧٥٨١ ، ٢١٣/٤ ، ورواه الهيثمي : مجمع الزوائد ومنبع الفوائد ، ٥/٩ وأخرجه الحاكم في المستدرك ٦٧٤/٢ ، وقال : صحيح الإسناد ، ووافقه الذهبي ، ورواه ابن أبي شيبة ، ٤٣٤/٧ ، وذكر الحافظ ابن كثير عدة طرق لهذا الحديث ، ثم قال : " فهذه طرق جيدة متعددة تفيد غلبة الظن أو القطع عند المتبحرين أن يعلى بن مرة حدّث بهذه القصة في الجملة " البداية والنهاية ١٣٩/٦-١٤٠ ، وأخرجه العلامة الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة : ٨٧٧/١ ، ثم قال : " وبالجملة فالحديث بهذه المتابعات جيد " ) .

[٣٥] ( رواه الدارمي رقم ١٧ ، وابن أبي شيبة ٤٣٦/٧ ، وابن عبد البر في التمهيد ٢٢٣/١ ، والذهبي : تاريخ الإسلام ووفيات المشاهير والأعلام ، ٣٤٥/١-٣٤٦، وابن كثير في البداية والنهاية ١٤١/٦، وقال : " هذا إسناد جيد ، رجاله ثقات " ، وذكره البقاعي في التفسير ١١٣/٤، وقال : " حديث صحيح "، ورواه الهيثمي في مجمع الزوائد ٧/٩ ، ثم قال : " ورواه الطبراني في الأوسط والبزار باختصار ، وفيه عبد الحكم ، ذكره ابن أبي حاتم ، ولم يخرجه أحد ، وبقية رجاله ثقات " ) .

[٣٦] ( رواه البخاري رقم ٥٦٥٢ ، ومسلم رقم ٢٥٧٦ ) .

[٣٧] ( فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني : ١١٥/١٠ ) .

لە کتێبی ( الاستيعاب ) ، و ( ابن الأثير ) یش لە ( أسد الغابة ) دا لە پێناسەی ( أم زفر ) دا فەرموویەتی : ئەو ئافرەتەیە کە تووش بووی جنۆکە بوو [٣٨] ، وە پێشەوا ( ابن قيم الجوزية ) فەرموویەتی : (( ويجوز أن صرع هذه المرأة السوداء من جهة الأرواح الخبيثة )) [٣٩] ، واتە : دەتوانرێت بووترێت کە تووشبوونی ئەو ئافرەتە لە لایەن جنۆکەوە بوو بێت .

**شەشەم :** فەرموودەی ( أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ) کە دەگێڕێتەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : " إِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلَى فِيهِ ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ " [٤٠] .

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە باوێشکی دا با دەستی بخاتە سەر دەمی ، چونکە شەیتان دەڕواتە ژوورەوە ، فەرموودەکەش زۆر بەئاشکرایی دەڵێت شەیتان دەڕواتە ژووەوە ، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت بووترێت . هەروەکو کەسانێکی نەزانکار دەڵێن : ئەگەر وابێت ، ئەوە هەموومان شێتین ، و کۆمەڵگاکەشمان شێتخانەیە !!! یان شێت سالاریە !!! ـ هەموو چوونە ژوورەوەیەك شێت بوونی لە گەڵدایە !!!

**پێشەوا** ( النووي ) فەرموویەتی : (( قَالَ الْعُلَمَاء : أُمِرَ بِكَظْمِ التَّثَاؤُب وَرَدّه وَوَضْع الْيَد عَلَى الْفَم ، لِئَلا يَبْلُغ الشَّيْطَان مُرَاده مِنْ تَشْوِيه صُورَته ، وَدُخُوله فَمه ، وَضَحِكَهُ مِنْهُ ، وَاللَّهُ أَعْلَم )) ، واتە : زانایان فەرموویانە : موسڵمان فەرمانی پێکراوە بەوەی کە باوێشکەکەی بخواتەوە ، بیگەڕێنێتەوە ، و دەستی دابنێت لە سەر دەمی ، بۆ ئەوەی کە شەیتان نەگاتە مەبەستی خۆی لە شێواندنی شێوە ، و ڕۆشتنە دەم ، و پێکەنین پێی ، خوای پەروەردگاریش زاناترە .

**حەوتەم :** فەرموودەی ( جابر ) ی کوڕی ( عبدالله ) کە دەگێڕێتەوە ، پێغەمبەری خوا : " وَاكْفِتُوا صِبْيَانَكُمْ عِنْدَ الْعِشَاءِ ، فَإِنَّ لِلْجِنِّ انْتِشَارًا وَخَطْفَةً " [٤١] .

واتە : وە ڕێگە بگرن لە چوونە دەرەوەی منداڵەکانتان لە شەواندا ، چونکە ، جنۆکە بڵاوبوونەوە و بردنی کتوپڕی هەیە .

**موسڵمانی بەڕێز :** فەرموودەکە هۆکاری ڕێگردنەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ پاراستنی منداڵەکانمان لە زیانی شەیتان ، نەك بۆ زیانی گیان لەبەر ، و بڵاوبوونەوەی کوندە پەپوو !!! هەروەکو کەسانی نەزانکار بۆ ئینکار کردنی ڕۆشتنی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ دەری دەبڕن !!!

ڕاڤەوانی قورئان ( الآلوسي ) لە تەفسیری ( روح المعاني : ٣ / ٤٨ ) دا هەندێك لە ڕیوایەتەکانی ئەم فەرموودەیەی بە بەڵگە هێناوەتەوە لە سەر ئەوەی کە شەیتان دەتوانێت مرۆڤ تووش بکات .

---

[٣٨] ( انظر ابن عبد البر : الاستيعاب في معرفة الأصحاب على هامش الإصابة في تمييز الصحابة لابن حجر العسقلاني ، ٤/٤٥٣ ) .

[٣٩] ( زاد المعاد في هدى خير العباد: ٣/١٨١ ) .

[٤٠] ( رواه مسلم في صحيحه ، برقم : ٢٩٩٥ ) .

[٤١] ( رواه البخاري في صحيحه ، برقم : ٣٣١٦ ) .

## ج : بەڵگەی هەستیاری و بینین :

**لەم بەشەی بەڵگەکان ناوی هەندێك لەو کەڵە زانا و پێشەوایانەی ئیسلام دەخەینە ڕوو کە خۆیان ئەو کارەیان هەست پێکردووە و بینیویانە بە چاوی خۆیان ، لەوانەش :**

**١ ـ پێشەوا ( أحمد بن حنبل ) :**

**لە کتێبی** ( طبقات الحنابلة ) **دا** [٤٢] **هاتووە ، کە** ( قاضي أبو الحسين بن أبي يعلى الفداء ) **دەگێڕێتەوە کە :** أن الإمام أحمد بن حنبل كان يجلس في مسجده ، فأنفذ إليه الخليفة العباس المتوكل صاحباً له يعلمه أن جارية بها صرع ، وسأله أن يدعو الله لها بالعافية ، فأخرج له أحمد نعلي خشب بشراك من خوص للوضوء ، فدفعه إلى صاحب له ، وقال له : امض إلى دار أمير المؤمنين ، وتجلس عند رأس الجارية وتقول له ، يعني الجن : قال لك أحمد : أيما أحب إليك تخرج من هذه الجارية ، أو تصفع بهذه النعل سبعين ؟ فمضى إليه ، وقال له مثل ما قال الإمام أحمد ، فقال له المارد على لسان الجارية : السمع والطاعة ، لو أمرنا أحمد أن لا نقيم بالعراق ما أقمنا به ، إنه أطاع الله ، ومن أطاع الله أطاعه كل شيء ، وخرج من الجارية وهدأت ورزقت أولاداً ، فلما مات أحمد عاودها المارد ، فأنفذ المتوكل إلى صاحبه أبي بكر المروذي وعرفه الحال ، فأخذ المروذي النعل

ومضى إلى الجارية ، فكلمه العفريت على لسانها : لا أخرج من هذه الجارية ولا أطيعك ولا أقبل منك ، أحمد بن حنبل أطاع الله ، فأمرنا بطاعته .

**وە** ( عبدالله ) **ی کوڕی** ( أحمد ) **کوڕی** ( حنبل ) **دەفەرمووێت :** قلت لأبي : إن قوماً يقولون : إن الجن لا يدخل في بدن المصروع من الإنس ، فقال : يا بني يكذبون ، وهو ذا يتكلم على لسانه [٤٣] ، **واتە : بە باوکم ووت : باوکە کەسانێك هەن دەڵێن : جنۆکە ناڕواتە گیانی تووشبووی مرۆڤەوە ، ئەویش فەرمووی : کوڕم درۆ دەکەن ، ئەوە نیە لە سەر زمانی نەخۆشەکەوە دەدوێت .**

**٢ ـ پێشەوا ( ابن حزم الظاهري ) :**

( ابن حزم الظاهري ) **فەرموویەتی :** (( وأما الصرع فإن الله عز وجل قال كالذي : ﴿ يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾ ( سورة البقرة : ٢٧٥ ) ، فذكر عز وجل تأثير الشيطان في المصروع ، ... فصح أن الشيطان يمس الإنسان الذي يسلطه الله عليه مساً كما جاء في القرآن ، يثير به من طبائعه السوداء والأبخرة المتصاعدة إلى الدماغ كما يخبر عن نفسه كل مصروع بلا خلاف منهم ، فيحدث الله عز وجل له الصرع والتخبط حينئذ كما نشاهده ، وهذا هو نص القرآن وما توجبه المشاهدة ، وما زاد على هذا فخرافات )) [٤٤]

**واتە : وە سەبارەت بە دەست لێوەشاندنی جنۆکە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی وەکو** ﴿ يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾ **ئەوەی کە شەیتان تووشی شێت بوونی کردووە ، لەمە ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی گاریگەری شەیتان دەکات لەو کەسانەی کە تووشیان کردوون ، ... وە بەمەش بۆمان ئاشکرا**

---

[٤٢] ( طبقات الحنابلة : ٢٣٣/١ ) .

[٤٣] ( مجموع الفتاوى ١٢/١٩، ٢٧٧/٢٤ ) .

[٤٤] ( الفصل في الملل والأهواء والنحل ، لابن حزم الظاهري : ٨٣/٥ ) .

دەبێت کە شەیتان مرۆڤێلێك تووش دەکات کە خوای پەروەردگار ڕێی پێداوون ، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ... وە ئەمەش دەقی قورئانی پیرۆزە و شتێکە هەستیاری و بینایی دەیسەلمێنێت ... .

**٣ ـ پێشەوا و شێخی پایە بەرزی ئیسلام ( ابن تيمية ) :**

**پێشەوا** ( ابن تيمية ) **فەرموویەتی** : (( إن دخول الجني بدن الإنس ، وتكلمه على لسانه بأنواع الكلام وغير ذلك أمر قد علمه كثير من الناس بالضرورة ... )) [٤٥] ، **واتە : بێگومان ڕۆشتنی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ ، و قسەکردنی لە سەر زمانی تووشبووەکەوە بەجۆرەها ووتە و جگە لەوەش ، کارێکی وایە زۆرێك لە خەڵك زانیویانە و پیویست بە بەڵگە ناکات .**

**٤ ـ پێشەوا ( ابن قيم الجوزية ) :**

**پێشەوا** ( ابن القيم ) **لە کتێبی بە سوودی** ( زاد المعاد في هدى خير العباد ) **دا بەشێکی تایبەتی داناوە لە ژێر ناونیشانی** : ( هديه ﷺ في علاج الصرع ) [٤٦] **تیایدا باسی دەست لێوەشاندنی جۆکەی کردووە بۆ مرۆڤ ، ئەوەش بە بەڵگەی هاتنی لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ، و ئیقرار کردنی پزیشکەکان بۆی و پاشان بە بەڵگەی هەستیاری و بینین بۆ ئەو کارە ، لەو ووتانەشی کە لەوێدا فەرموویەتی** : (( والحس والوجود شاهد به )) [٤٧] ، **واتە : هەستیاری و ڕوودانی لە واقیعدا بەڵگەیە لە سەری ، و پاشان باسی ئەوە دەکات کە مامۆستاکەی شێخ** ( ابن تيمية ) **ی بینیوە کە چۆن نەخۆشی لەو جۆرەی چارەسەر کردووە ، کە فەرموویەتی** : (( وشاهدت شيخنا يرسل إلى المصروع من يخاطب الروح التي فيه ويقول : قال لك الشيخ أخرجي ، فإن هذا لا يحل لك ، فيفيق المصروع ، وربما خاطبها بنفسه ، وربما كانت ماردة فيخرجها بالضرب ، فيفيق المصروع ، وقد شاهدنا نحن وغيرنا منه ذلك مراراً )) [٤٨] ، **واتە : وە بینیومە شێخمان کەسێکی ناردووە بۆ لای تووش بووەکە ، بۆ ئەوەی لە گەڵ جنۆکەی ناو لەشی بدوێت و پێی بڵێت : شێخ پێی فەرمووی کە بڕۆیتە دەرێ ، چونکە کارێکی ناڕەوایە بۆ تۆ ، دوا بەدوای ئەو ووتانە نەخۆشەکە چاك دەبووەوە ، وە ڕەنگە خۆی لە گەڵیا بدوایە ، وە لەوانەش جۆری جنۆکەکە ( مارد ) ببایە ، و بەلێدان دەری دەهێنا ، دوا بەدوای ئەو لێدانە نەخۆشەکە چاك دەبووەوە ، من جگە لە منیش زۆرجار ئەوەمان لێ دەبینی .**

**٥ ـ پێشەوا ( ابن حجر العسقلاني ) :**

**پێشەوا** ( ابن حجر العسقلاني ) **فەرموویەتی** : (( و الدلالة الوجودية فيمن يصرعه الجن من الإنسان كثيرة جداً )) [٤٩] ، **واتە : وە بەڵگەی بوون و ڕوودانی واقیعی لە سەر ئەوانەی کە جنۆکە دەستیان لێ دەوەشێنێت لە مرۆڤەکان زۆر زۆرن .**

---

[٤٥] ( الرد على المنطقيين : ص ٤٠٧ ) .

[٤٦] ( زاد المعاد : ٣/١٧٧-١٨١ ) .

[٤٧] ( المصدر السابق : ص ١٧٨ ) .

[٤٨] ( المصدر السابق : ص ١٧٩ ) .

[٤٩] ( بذل الطاعون في فضل الطاعون : ص ٨٣ ) .

**٦ ـ شێخ و ڕاڤەوانی قورئان ( محمود الآلوسي البغدادي ) :**

**شێخ لە تەفسیرەکەیدا و لـە سـورەتی ( البقرة ) دا باسـی تووشبوونی جنۆکە بۆ مـرۆڤ ، قسە کردنـی دەکات لە سەر زاری نەخۆشەکەوە ، و دەفـەرموویێت :** (( وهذا كالمشاهد المحسوس الذي يكاد يُعد منكره مكابراً منكراً للمشاهدات ... واعتقاد السلف وأهل السنة : أن ما دلت عليه أمور حقيقة ، واقعة كما أخبر الشرع عنـــها ، والتزام تأويلها كلها يستلزم خبطاً طويلاً لا يميل إليه إلا المعتزلة ومن حذا حـــذوهم )) [٥٠] **، واتـە : ئەمـەش وەکو بینراوی هەست پێکراوە ، وەکو ئەو شتانەی کە ئینکارکەرەکەی بە کەسێکی سەرکەش و خۆ بەزل زان دادەنرێت ، و بە کەسێك دادەنرێت کە شتە بیراوەکان ئینکار بکات ، وە بیروباوەڕی سەلەف و ئەهلی سوننە ئەوەیە کە ئەمانە شتێلێکن لە سەر حەقیقەتی خۆیانن ، هەر بەو شێوەش ڕوو دەدن کە شەرع باسی لێوە کردوون ، هەوڵدانیش بۆ تەئویل کردن ، و لادانی لەواتای خۆی تێکەڵ و پێکەڵ کردنێکی دوور و درێژە ، هیچ کەسێك بۆی ناڕوات جگە لە گرووپی لاڕێی موعتەزیلە نەبێت ، و ئەوانەش کە شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرتووە .**

**٧ ـ دەستەی گەورە زانایانی وڵاتی میرنشینی عەرەبی سعودی** ( هيئة كبار العلماء في المملكة العربية السعودية ) :

**ئەم دەستەیەی گەورە زانایانی سعودیە لە یەکێك لە فەتواکانیاندا هاتووە ، کە فەرموویانە :** (( و مس الجن للإنس أمر معلوم من الواقع ، وتستعمل للعلاج من مسه الأدوية الشرعية من الدعاء والقراءة عليه بشيء من القرآن )) [٥٢] ، **واتە : تووشکردنی جنۆکە بۆ مرۆڤ کارێکی زانرا و ئاشکرایە لە واقعدا ، وە بۆ چارەسەرکردنی ئەو تووش بوونەش کە بە هۆی جنۆکەوە دەبێت هەندی دەوای شەرعی بەکار دەهێنرێت لە پاڕانەوە و خوێندنەوەی هەندێك لە قورئانی پیرۆز .**

**لە کۆتایی ئەم بەڵگە هێنانەوانەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەتە ( صحیح ) ەکانی پێغەمبەری خوا ، چەندەها ڕوودا و سەرگوزەشتەی پێشەوایان و زانیان لە سەر ئەوە کۆڕان کە جنۆکە دەتوانێت بڕواتە ناو لەشی مۆرڤ و تووشیشی بکات ، وە ئەمەشە بیروڕای ئەهلی سوننە و سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتە ، جا ئەگەر وا بوو با بزانین کێن ئەوانەی کە ئینکاری ڕۆشتنی جنۆکە دەکەن بۆ ناو لەشی مرۆڤ ، لە گەڵ تووشکردنی ؟!!!**

## ❑ کێن ئەوانەی کە ئینکاری ڕۆشتنی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ ، و تووشکردنی دەکەن ❀ :

**هەریەك لە گروپی لاڕێی جەهمیەکان و موعتەزیلەش ، لە گەڵ ( هشام بن الحكم ) ی [٥٣] ڕافزی ، و ( أبو بكر الرازي ) [٥٤] ، بۆ ئەوە دەچن کە جنۆکە ناتوانێت کاریگەری بخاتە سەر مرۆڤ ، و بڕواتە ناو لەشی و**

---

[٥٠] ( روح المعاني : ٤٩/٣ ) .

[٥٢] ( فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء : قسم العقيدة : ١٨٣/١ ) .

❀ **پێشەوا** ( ابن القيم ) **فەرموویەتی** : أن أئمة أطباء اليونان ــ وعلى رأسهم بقراط ــ يقرون بصرع الجن للإنسان ، وأنه لا ينكر ذلك إلا جهلة الأطباء ، ممن تزندقوا وغلب عليهم التفكير المادي الذي ينكر عالم الغيب ولا يؤمن إلا بالمحسوس المشاهد ، وهؤلاء ليس معهم إلا الجهل ، وإلا فليس في الطب ما يدفع ذلك ( انظر : زاد المعاد : ١٧٨/٣ ) .

[٥٣] ( هشام بن الحكم الرافضي : من الرافضة الإمامية ، إليه تنسب فرقة الهشامية من فرق الروافضة ، وهو صاحب اعتقادات فاسدة وأقوال رديئة ، وله مصنفات أكثرها في الرد على خصومه ، توفي بالكوفــة ، واختلف في سنة وفاته ، فقيل سنة ١٧٩هــ ، وقيل سنة ١٢٨٧هــ ، انظر ترجمته في : الفهرست لابن النديم ، ١٧٥/١، وانظر لمعرفة معتقداته : مقالات الإسلاميين واختلاف المــصلين للأشــعري ، ١٠٦/١– ١٠٨ ، و الفرق بين الفرق للبغدادي ، ص ٦٥ ــ ٦٨ ) .

[٥٤] ( أبو بكر الرازي : محمد بن زكريا الرازي ، ولد في مدينة الري سنة ٢٥١هــ ، فيلسوف طبيب ، صاحب مقالات وعقائد فاسدة وردیئة ، كان مولعا بالموسيقى والغناء ونظم الشعر ، من مصنفاته : الحاوي في الطب ، توفي في بغداد سنة ٣١٣هــ . انظر ترجمته في الفهرست :٢٩٩/١، وعيون الأنباء في طبقات الأطباء لابن أبي أصيبعة :٣٠٩/١ ــ ٣٢١ ، وتاريخ حكماء الإسلام للبيهقي : ص ٢١ ــ ٢٢ ) .

تووشی بکات [٥٥] ، وە هەندێکیش لە بەناو ئەهلی سوننە . کەسانیك کە دراونەتە پاڵ ئەهلی سوننە . شوێنی ئەو بۆچوونەی ئەوان کەوتوون !!! ناودارترینی ئەوانەش ( البيضاوي ) [٥٧] و ( أبو السعود ) [٥٨] ، وە هەردووکیشیان خاوەن تەفسیرن وە لەوانەن کە هەستاون بە کورت کردنەوەی تەفسیری ( الكشاف ) ی ( الزمخشري ) کە یەکێکە لە سەرانی گروپی لاڕێی موعتەزیلە ، ئەمانە لە کۆندا ، وە لەم سەردەمەشدا کەسانێك وەکو : ( محمود شلتوت ) ، و ( طنطاوي ) ، و ( جوهري ) ، و ( المراغي ) ، و ( الغزالي ) ، ئەمەی خوارەوەش ووتەی هەندێکە لە سەرانی موعتەزیلە و شوێنکەوتوانی :

زەمەخشەری کە بە سەر و زیندوکەرەوەی بیروباوەڕی گروپی لاڕێی موعتەزیلە دادەنرێت لە سەردەمی خۆیدا لە تەفسیری ئایەتی سەرەوەی سورەتی بەقەرەدا دەڵێت : (( وتخبط الشيطان من زعمات العرب ، يزعمون أن الشيطان يخبط الإنسان فيصرع ... فورد على ما كانوا يعتقدون ، والمس الجنون ، ورجل ممسوس ، وهذا أيضاً من زعماتهم وأن الجني يمسه فيختلط عقله ، وكذلك جن الرجل معناه ضربته الجن ، ورؤيتهم لهم في الجن قصص وأخبار وعجائب ، وإنكار ذلك عندهم كإنكار المشاهدات )) [٥٩] .

واتە : تووشکردنی شەیتان یەکێکە لە ووتە نادروستەکانی عەرەب ، گومانیان وابوو کە شەیتان مرۆڤ تووش دەکات ... بۆیە ئایەتەکەش لە سەر ئەو گومانانەی ئەوان هاتووەتە خوارەوە ، ( المس ) یش بەواتای شێتی دێت ، وەك دەوترێت :

پیاوێکی شێت ، وە ئەمەش یەکێکی ترە لە ووتە نادرووستەکانی عەرەب ، ئەوەی کە گوایا جنۆکە مرۆڤ تووش دەکات و شێتی دەکات ، هەروەکو ئەوەیە : ( جنَّ الرجلُ ) واتە : جنۆکە لێیداوە ، وە لە دیدیان بۆ جنۆکە بەسەرهات و هەواڵی سەرسوڕهێنەریان هەیە ، ئینکار کردنی ئەو شتانەش لەلای ئەوان وەکو ئینکارکردنی شتە بینراوەکانە !!!

وە ( أبو علي الجبائي المعتزلي ) کە یەکێکە لە سەرانی موعتەزیلە ئەم کارە ئینکار دەکات دەڵێت : ئەم ووتەیە . توانای ڕۆشتنی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ . چونکە شەیتان بێ توانا ولاوازە ، ناتوانێت مرۆڤ تووش بکات و بیکوژێت ، وە گومانی وایە : کە جنۆکە و شەیتانەکان تەنها دەتوانن مرۆڤەکان تووشی وەسوەسە بکەن ، ئەو وەسوەسەش دەبێتە هۆی تووشکردنیان ، واتە : بێ ئەوەی بڕواتە لەشیەوە !!! [٦٠] .

هەروەها ( قاضي عبد الجبار الهمذاني المعتزلي ) یش ئەوە ئنکار دەکات کە شەیتان بتوانێت مرۆڤ تووش بکات !!! وە بۆ ئەوەش دەچێت کە کە تووشکردنی شەیتان تەنها لە وەسوەسەدایە [٦١] .

---

[٥٥] ( انظر مقالات الإسلاميين : ١/١٣٣ ، الإبانة في أصول الديانة : ص ١٢ ، فخر الدين الرازي : التفسير الكبير : مفاتيح الغيب : ٧/٨٨ ، مجموع الفتاوى ــ مصدر سابق ــ ١٩/١٢ ، آكام المرجان ص ١٢٨، الفتاوى الحديثية ص ٧٢ ) .

[٥٧] ( البيضاوي : عبدالله بن عمر بن محمد بن علي الشيرازي ، فارسي الأصل ، قاض ومفسر ، شافعي المذهب ، له عدة تصانيف في الفقه وأصوله ، والمنطق ، والتفسير ، توفي في تبريز سنة ٦٨٥ هـ أو ٦٩١ هـ . انظر ترجمته في : البداية والنهاية : ١٣/٣٠٩ ، وطبقات الشافعية : ٥/٥٩ ) .

[٥٨] ( أبو السعود : محمد بن محمد بن مصطفى العمادي الحنفي ، تركي الأصل ، تولى القضاء والإفتاء ، مفسر ، توفي سنة ٩٨٢ هـ في مدينة القسطنطينية . انظر ترجمته في : الفوائد البهية في تراجم الحنفية ، للكنوي : ص ٨٢ ، وشذرات الذهب في أخبار من ذهب ، لابن العماد الحنبلي : ٨ / ٣٩٨ ــ ٤٠٠ ) .

[٥٩] ( تفسير الكشاف : ١/١٦٤ ) .

[٦٠] ( الرازي : ٧/٨٩ ) .

[٦١] ( تنزيه القرآن عن المطاعن ، للقاضي عبد الجبار : ص ٥٤ ) .

وە هەریەك لە ( البيضاوي ) ، و ( أبو السعود ) بۆ ئەوە دەچن کە جنۆکە ناڕواتە لەشی مرۆڤەوە ، و بەهەمان شێوە و بۆچوونی سەری موعتەزیلە لە سەردەمی خۆیدا ( الزمخـــشري ) لە تەفسیرەکەیدا ( الكشاف ) و لە ڕاڤەی ئایەتەی ( ٢٧٥ ) سورەتی بەقەرەدا ئایەتەکە ڕاڤە دەکەن !!! بەڵکو هەمان ووتە و بۆچوونی ئەو دوبارە دەکەنەوە !!! و هیچ شتێکی نوێیان نەهێناوە !! وە هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو دووە تەفسیری ناوبراویان کورت کردووەتەوە ، بەلاّم بەتواوی هەوڵیان نەداوە کە تەفسیرەکەیان ڕزگار کەن لە بۆچوونە نادروستەکانی گروپی لاڕێی موعتەزیلە و سەرانی ئەو تاقم و گروپە لاڕێیە !!! [٦٢] .

وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

**١١ ی / ربيع الأول / ١٤٢٩ ك**

=====================



[٦٢] ( انظر : أنوار التنزيل وأسرار التأويل للبيضاوي : ٢/٦٦٧ ) .